# فیرعەونی بڕوادار



لێکۆڵینەوە : هەژیر ئیسماعیل لالە ئەحمەد

ئەکادیمیای زانستی کوردی

**ناوی کتێب : فیرعەونی بڕوادار**

**وەرگێڕان : هەژیر ئیسماعیل لالە ئەحمەد**

**ناوەند : ئەکادیمیای زانستی کوردی**

**ساڵی بڵاوکردنەوە : ٢٠٢٤**



# پێشەکی

## بسم الله الرحمن الرحيم

**اللهُمَّ صَلِّ على سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ الوَصــفِ وَالوَحْيِ وَالرِّسَالَةِ وَالحِكْمَةِ وَعَلى آلِهِ وَصَحـبِهِ وَسَلِّمْ تسليماً**

**ئەم بابەتە بە درێژایی مێژوو چەندین مشتومڕی لەسەر کراوە و یەکەم کەس کە ئەم بابەتەی وروژاندووە کەوا فیرعەون کەسێکی باوەڕدار و موسوڵمانە بریتیە لە شێخی ئەکبەر حەزرەتی موحییەدین ئیبن عەرەبی ، کە زانایەکی بێوێنە و پڕ لە زانست بوو ، لە سەردەمی خۆی و دوای سەردەمی خۆشی لە وێنەی زۆر کەم و دەگمەنە ، هەوڵ و ئامانجی ئەوەبوو خەڵک بخاتەوە سەر ڕێگای ڕاست و دروستی ئیسلام و بەدووریان بخاتەوە لە دوژمنایەتی و ئاشوب و شەڕ و کێشە و ناکۆکی ، چەندین بەرهەمی ناوازەی هەیە کە زۆر زانیاری نوێ و نەبیستراو و سەرنجڕاکێشی تێدایە ، هەرکەسێک کە تانە لە شێخی ئەکبەر ئیبن عەرەبی یان یەکێک لە ڕاکانی دەدات ، ئەوا سەرەتا پێویستە بزانێت تانەی لەکێ داوە و خۆی لە چ ئاستێکە تا بتوانێ تانە لە زانا و دانایەکی وا گەورە بدات ، بەو هیوایەم ئەم بەرهەمە خزمەتێک بێت بە وڵاتی پیرۆزی کوردستان و ئاینی پیرۆزی ئیسلام و ڕێبازی پیرۆزی شێخ ئیبن عەرەبی**

**لێکۆڵەر : هەژیر**

# پوختەیەک لە ژیاننامەی شێخ ئیبن عەرەبی

{سەرچاوەی ژیاننامە : شمس المغرب سيرة الشيخ الأكبر محيي الدين ابن عربي و مذهبه ، د.محمد علي حاج يوسف ، فصلت للدراسات و الترجمة و النشر – حلب ، چاپی یەکەم ، ٢٠٠٦}

شێخی ئەکبەر موحیەدینی ئیبن عەرەبی ناوی موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی عەبدوڵلای حاتەمی طائییە ، نەوەی عەبدوڵای کوڕی حاتەمە کە برای عودەی کوڕی حاتەمە کە هاوەڵی پەیامهێنەر بوو (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) ، شێخ ئیبن عەرەبی پێی دەوترێت موحیەدین و باوکی عەبدوڵلا و باوکی ئەبوبەکر و دەناسرێتەوە بە حاتەمی و تائی و ئیبن عەرەبی و سوڵتانی خوداناسان و پێشەوای گوێڕایەڵانی خودا و گۆگردی سور و شێخی ئەکبەر (شێخی هەرەمەزن – زانای هەرەمەزن) ، لە شاری مرسیە لە ئەندەلوس لەدایکبووە لە ساڵی ٥٦٠ کۆچی بەرامبەر بە ١١٦٥ زاینی (٢٦-٧-١١٦٥) و پاشان کۆچی کردووە بۆ ئیشبیلیە ساڵی ١١٧٢ و بۆماوەی نزیکەی بیست ساڵ لەوێ ماوەتەوە کە چەند جارێک لەوێوە چووەوە بۆ مەغریب و تونس ، پاشان کۆچ دەکات بەرەو حەز ساڵی ١٢٠١ و ئیتر ناگەڕێتەوە بۆ ئەندەلوس ، ماوەیەک لە میسر ماوەتەوە و پاشان ڕۆیشتووە بۆ مەککە و لەوێ ماوەتەوە بۆ خوداپەرستی و وانەوتنەوە لە مزگەوتی حەرام کە تێیدا خودا چەندین زانستی پیرۆزی بەسەر دەڕژێنێت و لە کتێبەکەی بەناوی فتوحاتی مەککی تۆماری دەکات ، پاشان ڕۆیشتووە بۆ عێراق و هاتووەتە بەغداد و موسڵ پاشان بە وڵاتی ڕۆمدا گەشتی کردووە و ماوەیەک لەوێدا ماوەتەوە و ڕێزێکی زۆری لێ نراوە لەلایەن کیکاوس کە پادشایان بوو ، دوای چەند گەشتێک بۆ عێراق و میسر و سوریا و فەلەستین ، لەکۆتاییدا جێگیر دەبێت لە دیمەشق ساڵی ١٢٢٣ و لە ڕێکەوتی (٩-١١-١٢٤٠) کۆچی دوایی دەکات و جەستەی پیرۆزی لەسەر شاخی قاسیون بەخاک دەسپێردرێت ، پاشان سوڵتان سەلیم ساڵی ١٥١٦ کاتێک دیمەشق دەگرێت مزگەوتێکی گەورە لەسەر گۆڕی پیرۆزی دروست دەکات ، شێخ موحیەدین زانستی قورئانی لە ئیشبیلیە خوێندووە لەلای شێخ ئەبوبەکری کوڕی خلف بە هەر حەوت خوێندنەوەکە و وانەکانی شیکردنەوە (تەفسیر)ی خوێندووە لە چەند زانایەکەوە لەوانەش :

- ئەبوبەکر موحەممەد بن ابي جمره
- ئیبن زرقون
- ابي محمد عبدالحقی ئیشبیلی ئەزدی
- ئەبو قاسمی خزستانی
- ابي الحسن بن ابي نصر

شێخ موحیەدین توانایەکی ناوازە و بێوێنەی هەبوو لە زانستی تەسەوف و دەیان نامە و نوسراوی لەسەر ئەم بابەتە هەیە و بەپێی وتەی عەبدولڕەحمانی جامی خاوەنی کتێبی "نفحات الأنس" ژمارەی بەرهەمەکانی شێخ موحیەدین دەگاتە زیاتر لە پێنج سەد کتێب (٥٠٠) ، یەکێک لەو بەرهەمانە و گرنگترینیان بریتیە لە کتێبی "فتوحاتی مەککی" کە گرنگترین بەرهەمە لە مێژووی ئیسلامدا و بەڵکو تەنانەت لە مێژووی مرۆڤایەتیدا ، یەکێکی تر لە بەرهەمەکانی بریتیە لە تەفسیری قورئان کە خاوەنی کتێبی "فوات الوفیات" دەڵێت کەوا ژمارەیان گەیشتۆتە ٩٥ بەرگ ، هەروەها تەفسیرێکی قورئانی هەیە کە تەفسیری مەزنی پێ دەڵێن و کاتێک نوسی بەردەوام بوو هەتا گەیشتە ئایەتی "وعلمناه من لدنا علما" (واتا ئێمە زانستی خوداییمان پێ بەخشی) و لە شیکردنەوەی ئەو ئایەتەدا بوو کە کۆچی دوایی کرد ، هەروەها کتێبی "فصوص الحکم" ی هەیە کە لە سەرەتاکەی دەڵێت کەوا پەیامهێنەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) ی دیوە لە خەودا و کتێبێکی پێ داوە و فەرموویەتی کە ئەم کتێبە بخاتە بەردەست خەڵک بۆ ئەوەی لێی سودمەند ببن ، ئەویش کتێبەکەی بەو شێوەیە نوسیووە بەبێ ئەوەی هیچ زیاد و کەمی لێ بکات ، هەروەها کۆمەڵە بەرهەمێکی تریش لەوانە :

- محاضرة الأبرار
- إنشاء الدوائر
- عقلة المستوفز
- عنقاء المغرب في صفة ختم الأولياء و شمس المغرب

- **ترجمان الأشواق**
- **التدبيرات الإلهية في إصلاح المملكة الإنسانية**
- **مواقع النجوم و مطالع أهلة أسرار العلوم**
- **الجمع و التفصيل في حقائق التنزيل**
- **الجذوة المقتبسة و الخطرة المختلة**
- **كشف المعنى في تفسير الأسماء الحسنى**
- **المعارف الإلهية**
- **الإسرا إلى المقام الأسرى**
- **مشاهد الأسرار القدسية و مطالع الأنوار الإلهية**
- **الفتوحات المدنية**
- **الأحاديث القدسية**

## پێشەکی و هۆکاری لێکۆڵینەوە لەم بابەتە :

**ئەم بابەتە بریتیە لە باسێک لە فیرعەونەکەی سەردەمی حەزرەتی موسا ، کە خۆی و سوپاکەی لەناو دەریادا خنکان بەڵام تەنها فیرعەون جەستەی دۆزرایەوە ، باسەکە لەوەدایە کە ئایا ئەم فیرعەونە بڕواداربووە یان بێباوەڕ بووە کاتێک مردووە؟ یەکەم کەس کە فەرمووبێتی کەوا فیرعەون بە بڕواداری مردووە بریتیبوو لە شێخی ئەکبەر و جێگەداری پەیامهێنەر ، تاجی سەر حەزرەتی شێخ موحیەدین ئیبن عەرەبی کە یەکێکە لە زاناترین و داناترین کەسەکانی ناو ئاینی پیرۆزی ئیسلام کە بەشێوە دروست و ڕاستەکە لە ئاین تێگەیشتبێت و دەیان و سەدان بەرهەمی جۆراوجۆری تێیدا هەبێت ، ئەگەرچی هەر لەسەردەمی شێخ ئیبن عەرەبیەوە دژایەتیەکی زۆری کراوە لەسەر ئەم بابەتە و تەنانەت هەندێ بەناو زانای خۆپەرست بە کافر و بێباوەڕیان داناوە لەسەر چەند بابەتێک کە ئەم بابەتە یەکێکیانە ، بەڵام بەڵگە عەقڵی و نەقلیەکان هەمووی پشتڕاستکەرەوەی مردنی فیرعەونن بە باوەڕداری کە لەم لێکۆڵینەوەیەدا بەڵگەکان دەهێنمەوە و دەبمە درێژەپێدەری ڕێگا و بیروبۆچوونەکانی شێخ ئیبن عەرەبی ، پشت بەخوا دەبەستم و داوای هیمەت لە پیری دەستگیرم شاهی کەسنەزان دەکەم کە ئەم کارەم ئاسان و ڕاست بێت و بتوانم ئەوەی پێویستە لە بەڵگەی عەقڵی و نەقڵی بیخەمە ڕوو و ئەو ئاینەی کە بە ئاراستەی توندڕەوی براوە لەلایەن خۆپەرستانەوە ، بیهێنینەوە سەر ڕێگا دروستەکەی کە ئەویش پەیڕەو و ڕێگای شێخی ئەکبەر موحیەدینی ئیبن عەرەبیە کە خودا دەرگای ئەو زانستەی لێ کردۆتەوە کە حەزرەتی موسا دەیویست فێری ببێت لە حەزرەتی خضرەوە (سەلامی خودایان لەسەربێت) ، هەروەها لەم بەرهەمەدا وەڵامی ئەو بەرهەمانە دەدەمەوە کە دژ بە شێخی ئەکبەر لە بابەتی فیرعەوندا نوسراوە و دیارترینیشیان بەرهەمەکەی (ئیبن تەیمیەی حەڕانی) کە بە دڵێکی ڕەشی پڕ لە ڕقەوە وەڵامی شێخی ئەکبەر ئیبن عەرەبی داوەتەوە ، بەکارهێنانی زمانی توند و دڵ ڕەشی لەو جۆرە کەسانە نیشانەیە بۆ ئەوەی ئەگەر زانستی پێویستیان هەبوایە بۆ وەڵامدانەوە پەنایان نەدەبردە بەر ئەم جۆرە شێوازە لە وەڵامدانەوە**

## فەرمایشتەکانی شێخ ئیبن عەرەبی لەسەر فیرعەون :

لە کتێبی "فصوص الحکم" کە نوسراوی شێخ ئیبن عەرەبیە (سەرچاوە : فصوص الحكم ، الشيخ الأكبر محيي الدين إبن عربي ، تع : أبو العلا عفيفي ، دار التنوع الثقافي – الدمشق ، چاپی یەکەم ، ٢٠١٩) لە چەند شوێنێک باسی فیرعەون کراوە بەم شێوەیە :

1. کاتێک بنەماڵەی فیرعەون موسایان دۆزیەوە لەناو ئاوی پاڵ درەختێک بەمەش فیرعەون ناوی لێنا موسا ، چونکە لە زمانی قبتی دا "مو" واتا ئاو و "سا" واتا درەخت ، هەر بۆیە کاتێک لەناو دارەمەیتەکە دۆزیانەوە لەناو ئاو و لە پاڵ درەختێک بەمەش ئەو ناوەیان لێی نا ، فیرعەون ویستی بیکوژێت ، بەڵام خێزانەکەی کە لەلایەن خوداوە ئەو قسەیەی بەسەر زوباندا هات وەک لە قورئاندا هاتووە کە وتی : («قُـرَّتُ عَـيْنٍ لِـي ولَـكَ») (واتا دەبێتە مایەی ئارامی و دڵخۆشی بۆ هەردووکمان) لە ڕاستیشدا ئەمە بەو شێوەیە بوو کەوا موسا بوو بە مایەی ئارامی و دڵخۆشی بۆ فیرعەون کاتێک لە ئاودا خنکا بەو باوەڕداریەی خودا پێی بەخشی لەکاتی خنکاندا ، هەر بۆیە خودا بە جەستە و لاشەیەکی خاوێنکەر و خاوێنکراوەوە ڕوحی فیرعەونی کێشا چونکە ئەوکاتەی فیرعەون مرد لەکاتی باوەڕداریەتیەکەی بوو ، باوەڕداربوونیش ئەوەی پێش خۆی دەسڕێتەوە ، خودا کردی بە ئایەتێک تاکو هیچ کەسێک لە ڕەحم و بەخشندەیی خودا بێهیوا نەبێت وەک خۆی دەفەرموێت :" «فإنـه لا يَيْـأسُ مِـنْ رَوْحِ اللَّـهِ إِلَّـا الْقَـوْمُ الْكَـافِرُونَ») (واتا تەنها بێباوەڕان بێهیوا دەبن لە بەخشندەیی و ڕەحمەتی خودا) ، ئەگەر فیرعەون لەو کەسانە بوایە کە بێهیوا بوایە ئەوا هەنگاوی بەرەو باوەرهێنان نەدەهێنا (لاپەڕە ١٩٦ - ١٩٧ )

2. کاتێک خودا دەفەرموێت : («فَلَـمْ يَـكُ يَـنفَعُهُمْ إِيمـانُهمْ لَمَّـا رَأَوْا بَأْسَـنا سُـنَّتَ اللَّـهِ الَّتِـي قَـدْ خَلَـتْ فِـي عِبـادِهِ» ) (واتا : باوەڕداریان سودیان پێ ناگەیەنێت دوای ئەوەی سزای ئێمە دەبینن

، ئەوە مــــامەڵەیەکی خـــودایە لەگەڵ بەندەکانیــــدا) ئەوا لێــــرەدا ئەمە ئەوە ناگەیەنێـــت کە لە دوارۆژدا ئەو بــاوەڕە ســودی بۆیــان نابێــت ، ئەمەش واتــا بــاوەڕدارییەکە نــابێتە هــۆی ئەوەی نەمــرن و لە ژیانـــدا بمێـــنن ، ئەوەتـــا فیــرعەون ڕووحـــی کێشـــرا بە بـــڕواداریەوە ، هەروەهـــا کاتێـــک فیــرعەون بەو ڕێــگەی وشــکانیە ڕۆیشــت کە لە ئەنجــامی ئەوەی موســا دارەکەی کێشــا بە دەریــاکەدا دەرکەوت ، ئەوکــاتە فیــرعەون دڵنیــا نەبــوو بەوەی لەنــاو دەچێــت و دەمرێــت ، هەربــۆیە کاتێــک خنکــا بــاوەڕی بەوە هێنــا کە بەنــی ئیســرائیل باوەڕیــان پێــی هێنــاوە بەڵکــو ڕزگــاری ببێــت ، بەڵام ڕزگــاری بــوو بە شــێوەیەک کە پــێچەوانەی ئەوە بێــت کە ئەو دەیویســت ، بەوەی کەوا ڕووحــی کێشــرا بە بــڕواداریەوە ، بەمەش خــودا ڕزگــاری کــرد لە ســزای دوارۆژ و هەروەهــا جەستەشــی ڕزگــارکرد و هێنــایە دەرەوە وەک خــودا دەفەرموێــت : («فَـــالْيَوْمَ نُنجِّيــكَ بِبَــدَنِكَ لِتكُــونَ لِمَــنْ خَلْفَــكَ آيَــةً») (واتــا : ئەمــڕۆ ڕزگــارت دەکەیــن بە جەســتەتەوە بــۆ ئەوەی بــۆ ئەوانەی دوای خــۆت ببیــت بە ئــایەت و بەسەرهاتێک و نیشانەیەک) (لاپەڕە ٢٠٧)

3. پێغەمــبەر (ســـەڵەوات لەســـەر خـــۆی و بنەمـــاڵەکەی) فەرمـــوویەتی : "مـــرۆڤ لەســـەر ئەوە زینـــدوو دەکــرێتەوە کە لەســەری مــردووە) بەمەش فیــرعەون لەســەر باوەڕهێنــان مــرد ، بــۆیە خــاوەنی بــاوەڕە (لاپەڕە ٢٠٨)

لە کتێبــی "الفتوحــات المكيــة" کە نوســراوی شــێخ ئیــبن عەرەبــیە (ســەرچاوە : الفتوحــات المكيــة ، الشــيخ الأكبــر محيــي الــدين إبــن عربــي ، چاپخــانەی بــۆلاق – قــاهیرە ، چــاپی ســێهەم، ١٨٥٧) لە چەنــد شــوێنێک باسی فیرعەون کراوە بەم شێوەیە :

1. قوشـــەیری لە نامەکەیـــدا لە هەنـــدێک لە پیاوچاکـــانەوە دەگێـــڕێتەوە کەوا فەرموویـــانە : "هەرکەس خــۆی پــێ باشــتر بێــت لە فیــرعەون ئەوا لــوتبەرزی نوانــدووە" ، هەرکەس خــۆی پــێ باشــتر بــوو

لـۆمەی بـکە و پێـی بڵـێ کەوا نابێـت خـۆی بەباشـتر بزانێـت چـونکە خـودا ڕەحـمەت و بەزەیـیەکەی هەموو بونەوەران دەگرێتەوە و ئەمە لە گەورەترین بابەتەکانە (بەرگی یەکەم – لاپەڕە ٥٢٧)

2. خـــودا لەگەڵ هەمووانـــدایە ، تەنـــانەت فیـــرعەون کاتێـــک لەســـەر دەســـەڵات بـــوو و بێبـــاوەڕ و هاوەڵــدانەر بــوو و هاوەڵــدانەریش پیســە ، ســەرەڕای ئەوەش موســا و هــارون کە خــودا فەرمــانیکردن بچـن بـۆلای ، و خـودا فەرمـووی : " إِنَّنِـي مَعَكُمَـا أَسْـمَعُ وأَرى" (واتـا : مـن لەگەڵتانـدام دەبیسـتم و دەبینم) (بەرگی یەکەم – لاپەڕە ٥٣٧)

3. فیـرعەون لە ناخـدا وەک هەر بـوونەوەرێکی تـر مـۆری گەورەیـی و مەزنـی خـودا بەسـەر دڵیـدا دراوە ، بەڵام لە ڕووکەشیدا بەو شێوەیە نەبـوو ، هەربـۆیە خـودا حەزرەتـی موسـا و هـارونی بـۆ نـارد بـۆ ئەوەی بە زمـانێکی نەرمونیـان لەگەڵـی بـدوێن تـاکو بەیـادی بێـتەوە یـاخود لەخـوا بترسـێت ، ئەمەش بـۆ ئەوەی ڕوکەش و نـاخی ببێـت بە یەکێـک ، دڵـی بەردەوام بـوو لە پـاڕانەوە لە خـودا و بە زمـانیش دەری بـڕی کاتێـک بێهیـوا بـوو لە سـەرباز و شـوێنکەوتەوانی و لەکـاتی خنکانیـدا بێدەسـەڵاتی و لاوازی خـۆی بینـی و ئەوکـات هـاتە بەردەم دەرگـای پەروەردگـار و لێـی پـاڕایەوە ، کاتێـک جادووبازەکـان گەڕانەوە لە کارەکانیـان وتیـان : "باوەڕمـان بە خـودای هەردوو جیهـان هێنـا" ، بەڵام فیـرعەون وتـی : "بـاوەڕم بەو خـودایە هێنـا کە بەنـی ئیسـرائیل باوەڕیـان پێـی هێنـاوە" و پاشـان وتـی "منـیش لە موسـوڵمانانم" بەمەش ئەوەی لە ناخیـدا بـوو بە زمـانی درکانـدی ، بـۆ لابردنـی گومـان ئەو خـودایەی دیـاریکرد کە بـاوەڕی پێهێنـاوە کاتێـک وتـی (خـودای بەنـی ئیسـرائیل) و دۆخـی خـۆی دیـاریکرد کاتێـک وتـی (منـیش لە موسـوڵمانانم) و ئەم گفتوگـۆیەی لەگەڵ خـودادا بـوو بەوەی دەیزانـی کە خـودا دەیبینێـت و دەیبیسـتێت بەمەش خـودای گەورە وەڵامیـدایەوە و وایلێکـرد وەڵامەکە ببیسـتێت کاتێـک فەرمـووی : "ئێسـتا بـاوەڕت هێنـا" ، پاشـان خـودا پـێش مردنـی فیـرعەون مـژدەی ئەوەی پێـدا کە جەسـتەی ڕزگـار دەکـات و دەری دەهێنێـت لە دەریـاکە ئەمەش بـۆ ئەوەی بـۆ ئەوانەی دوای خـۆی ببێـتە ڕێنیشـاندەر بـۆ خودا پەرسـتی کە ئەوانەی

**دوای خــۆی ئەوە بڵــێن کە ئەم وتــویەتی دەبێــتە نیشــانەی ڕزگــاربوون ، فیــرعەون لە باشــترین کاتــدا ڕووحــی کێشــرا و مــرد کە ئەویــش ئاشــکراکردنی بــاوەڕدارێتی و وتنێتــی بە زووبــان ، ئەمەش بــۆ ئەوەی هــیچ کەسێک بێهیــوا نەبێت لە ڕەحــم و بەزەیــی خــودا ، بــاوەڕدارێتی لە ناخیــدا دەهــات و دەچــوو ، کە خــودا دەفەرموێــت : ( فَلَــمْ يَــكُ يَــنفَعُهُمْ إِيمَــانُهُمْ لَمَّــا رَأَوْا بَأْسَــنا)** (واتــا : **باوەڕهێنانەکەیــان ســودی پێیــان نەدەگەیانــد کــاتێ ســزای ئێمەیــان بینــی**) **ئەم ئــایەتە زۆر ڕوونە کە مەبەســت پێــێ ئەوەیە کە باوەڕیــان ســودیان پێناگەیەنێــت بەڵکــو خــودا ســود دەگەینێــت ، و کاتێــک خــودا دەفەرموێت : (سُــنَّتَ اللَّهِ الَّتِــي قَــدْ خَلَــتْ فِــي عِبَــادِهِ)** (واتــا : **مــامەڵەیەکی خــودایە لەگەڵ بەندەکانیــدا**) **ئەمەش واتــا باوەڕهێنــان لەکــاتی بینینــی ســزایەک کە پێشــتر خەڵــک نەیــدیبێت ، بێباوەڕەکــان وەک خــودای گەورە دەفەرموێــت : (ضَــلَّ مَــن تَــدْعُونَ إِلَّــا إِيَّــاهُ)** (واتــا : **کاتێــک بێباوەڕەکــان دەچــوونە نــاو کەشــتی و شــەپۆلی ئــاوەکە کەشتیەکەی دەهێنــایە جــوڵەی تونــد ، هانایــان بــۆ خــودا دەبــرد ، بەڵام کە دەهــاتنەوە ســەر وشــکانی داوایــان لە بتەکــان دەکــرد**) **ئەم ئــایەتەش واتــا ئەگەر خــودا ئەوانەی ســەر کەشــتیەکەی لەوکــاتەدا بمردانــایە ئەوا بە بــاوەڕداری دەمــردن ، بەڵام فیــرعەون لەکــاتی باوەڕهێنانــدا گیــانی کێشــرا و بە بــاوەڕداری مــرد ، زیــاتر نەژیــا بــۆ ئەوەی لەدوای باوەڕهێنــان نەگەڕێــتەوە ســەر ئەوەی پێشــتر دەیکــرد** (**بەرگــی دووەم – لاپەڕە ٢٧٦**)

4. **کاتێــک خــودا فەرمــووی : (فَــأَوْرَدَهُمُ النَّــارَ)** (واتــا : **خــودا دەیانخــاتە نــاو دۆزەخ و ئــاگرەوە – لێرەشــدا مەبەســت ئــالی فیــرعەونە**) **ئەوا لێــرەدا مەبەســت پێــی ئــالی فیــرعەونە نەک خــودی فیــرعەون ئەگەرنــا دەبــوو خــودا بفەرموێــت** (**فرعــون و آلــە**) **، ڕەحمەتــی خــوداش زۆر فــراوانە چــۆن دەبێــت بــاوەڕی کەسێک وەرنەگرێــت کە لەنــاو ئــاودا دەخنکێــت بە بێدەســەڵاتی لەکاتێکــدا خــودا خــۆی دەفەرموێت : (أَمَّــنْ يُجِيــبُ الْمُضْــطَرَّ إِذا دَعَــاهُ ويَكْشِــفُ السُّــوءَ)** (واتــا : **کــێ هەیە جگە لە خــودا کە وەڵامــی کەســە ناچارەکــان بــداتەوە و نەهــامەتی و ناڕەحەتیــان لەســەر لابــدات**) **، کەسێک**

ئەگەر ناچـار بێـت خـودا وەڵامـی دەداتەوە و نەهـامەتیەکەی لەسـەر لادەدات ، چ جـای فیـرعەون کە باوەڕی هێناوە پڕ بە دڵ و بە ڕاستگۆیی (بەرگی دووەم – لاپەڕە ٢٧٧)

5. فیـرعەون کاتێـک نزیکبـوو بخنکێت و وتـی : (قَـالَ آمَنـتُ أَنَّـهُ لا إِلـهَ إِلَّـا الَّـذِي آمَنَـتْ بِـهِ بَنُـوا إِسْـرائِيلَ) (واتـا : فیـرعەون وتـی بـاوەڕم هێنـا بەوەی هـیچ خـودایەک نییە جـگە لەو خـودایەی بەنـی ئیسـرائیل باوەڕیـان پێـی هێنـا) ئەمە پێـی دەوترێـت یەکخوداپەرسـتی فەریادڕەسیانە ، ئەم بـاوەڕەی ڕاگەیانـد تـا ئەوانەی پەردە دراوە بەسـەر گوێیـان ئەم قسـەیە ببیسـتن ، فیـرعەون ویسـتی بە گەلەکەی بڵـێ کە گەڕاوەتەوە لەوەی کە دەیـوت مـن خوداتـانم ، کاتێـک فیـرعەون ئەو ڕووداوی خنکـانەی بینـی کە بەسـەری هـات بـاوەڕی هێنـا بەمەش سـزای دونیـای لەسـەر لادرا و دواتـر خـودای گەورە بـاوەڕەکەی پشتڕاست کـردەوە کە فەرمووی : (آلْـآنَ وقَـدْ عَصَـيْتَ قَبْـلُ) (واتـا : ئێسـتا بـاوەڕت هێنـا لەکاتێکـدا پێشـتر بێفەرمانیـت دەکـرد) ئەمەش نیشـانە و ئامـاژەیەک بـوو لە ڕاسـتگۆیی فیـرعەون لە بڕوابـوونەکەی بە خـودا ، خـۆ ئەگەر ڕاسـتگۆ نەبـوایە ئەوا خـودای گەورە هەمـان ئەو شـتەی پـێ دەفەرمـوو کە بە دەشـتەکیەکانی فەرمووبـوو : (الـذين قـالوا آمنـا قُـلْ لَـمْ تؤْمِنُـوا ولكِـنْ قُولُـوا أَسْـلَمْنا ولَمَّـا يَـدْخُلِ الْإِيمـانُ فـي قُلُـوبِكُمْ) (ئەوانەی کە دەیـانوت باوەڕمان هێنـاوە بڵـێ باوەڕتـان نەهێنـاوە بەڵام موسـوڵمان بـوون و بـاوەڕ نەچـووە بە دڵتانـدا) {تێبینـی لێکـۆڵەری کتێـب لەسـەر ئەم دێـڕە : ئەمەش ئامـاژەیە بـۆ ئەوەی کەوا فیـرعەون موسـوڵمان بـووە و بـڕواداریش } ، خـوداش شـاهیدی دا بـۆ بـاوەڕداریتی فیـرعەون و هەرکەسـیش خـودا شـاهیدی بـۆ بـاوەڕی بـدات ئەوا پاداشـتی دەداتەوە لەبەرامـبەر ڕاسـتگۆییەکەی ، ئەگەرچـی پێشـتر پـیس و بێبـاوەڕ بـوو بەڵام کە بـاوەڕی هێنـا پێویسـتی بەوەکـرد خـۆی بشـوات و خـۆی خـاوێن بکـاتەوە ، هەر بـۆیە دەریـاکە بـوو بە شـوێنی خـاوێنکردنەوەی و شـۆردنی ، بەم شـێوەیەش خـودای گەورە بە خـاوێنی گەڕانـدیەوە بـۆلای خـۆی ، هۆکـاری دروسـتبوونی باوەڕەکەشـی ئەوەبـوو کاتێـک بینـی دەریـاکە بەشـێکی بـووە بە وشـکانی و باوەڕدارەکـانی شـوێنکەوتووی حەزرەتـی موسـای پێـدا تێپەڕ

دەبـــن ، فیـــرعەون تێگەیشـــت کە ئەمەیـــان بە باوەڕەکەیـــان بەدەســـت هێنـــاوە (بەرگـــی دووەم – لاپەڕە ٤١٠)

6. کاتێـک فیـرعەون کەوتە نـاو ئـاوەکە بـاوەڕی هێنـا و بەیـادی هـاتەوە و ترسـا لە خـودا ، هەروەهـا قســەی نەرمونیـــانی حەزرەتـــی موســـا و هـــارون کاریگەریـــان لەســـەری دڵـــی بەجێهێشـــتبوو ، ئەمەش دەتگەیەنێـــت بەوەی کەوا بـــاوەڕبوونەکەی بە خـــودا قبـــوڵ بـــووە چـــونکە لەســـەر بنچیـــنەی بەیادهـــاتنەوەی خـــودا و ترســـان لێـــی بـــووە نەوەک بـــاوەڕداربوونەکەی بەســـترابێتەوە بە کـــاتێکی دیاریکراو کە کاتی خنکانەکەیەتی (بەرگی دووەم – لاپەڕە ٤١١)

لە سـەرچاوەی (الكبريـت الأحمـر المسـمى التـاريخ الأشـهر – محيـي الـدين الطعمـي ، المكتبـة الازهريـة للتـراث "مصـر"، ٢٠١٧ ، لاپەڕە ١١١) شـێخ مـوحیەدینی طەعمـی لەوێشـدا ئامـاژە بە فەرمایشـتەکەی شـێخ ئیـبن عەرەبـی دەکـات و دەفەرموێـت : "شـێخ ئیـبن عەرەبـی بە ڕوونـی و ئاشـکرا ئامـاژەی بەوەداوە لە کتێبـی (فصـوص الحكـم) کەوا فیـرعەون نەجـاتی دەبێـت ، هەروەهـا <جەلالـی دوانـی> نـامەیەکی هەیە لەســەر ڕزگـاربوونی فیـرعەون ، کە چـاپکراوە و مـن هەمـوویم خوێنـدۆتەوە ، هەنـدێک لە زانـا ڕووکەشـیەکان دژ بە شـێخ ئیـبن عەرەبـی وەسـتان لەم بـابەتەدا ، لەڕاسـتیدا ئەوان لە مەبەسـتی شـێخ تێنەگەیشـتبوون ، کەوا شێخ ئیـبن عەرەبـی مەبەسـتی ئەوە بـووە کەوا فیـرعەون بڕواهێنـانەکەی پەیوەسـت نەبـووە بە کـاتەوە ، واتـا لە کـاتی خنکانـدنی کە بـاوەڕی نەبـووە پێشـتر ، کاتێـک ڕاسـتیەکەی بینـی و بەرچـاوی ڕوون بـوو و تێگەیشت کە حەزرەتی موسا لەسەر حەقە و ئەو لەسەر هەڵەیە ئەوکات بڕوای هێنا"

## نامەیەکی ئیبن تەیمیە لە وەڵامدانەوەی شێخ ئیبن عەرەبی و و تێبینیەکانی لێکۆڵەر لەسەری :

ئیبن تەیمیە کە بە درێژایی تەمەنی بە دڵێکی ڕەش و زمانێکی توندەوە بەرهەمەکانی دەنوسیەوە ، شێخی ئەکبەر موحیەدینی ئیبن عەرەبیش بێبەش نەبوو لە زمانی توند و دڵی ڕەشی ئیبن تەیمیە ، ئەوانەی دەڵێن کەوا شێخ ئیبن عەرەبی ئەم ڕایەی کە لەسەر فیرعەون هەیەتی هی خۆی نیە بەڵکو خزاوەتە ناو بەرهەمەکانی ، منیش دەڵێم ئەگەر وابوایە ئیبن تەیمیە وەڵامی نەدەدایەوە و نامەیەکی نەدەنوسی لە دژی ئەو ڕایەی شێخی ئەکبەر ، بەڵام کە نامەی نوسی بەڵگەیەکی ڕون و ئاشکرایە کە ئەو فەرمایشتە فەرمایشتی شێخی ئەکبەرە ، منیش لێرەدا وەڵامی نامەکەی دەدەمەوە بەو فەزڵەی خودا پێمانی بەخشیوە لە وەڵامدانەوەی ناحەز و چەواشەکارەن :

1. ئیبن تەیمیە وەک پیشەی هەمیشەی خۆی لە کتێبەکانی پشت دەبەستێت بە کتێبی ئاینەکانی تر بۆ شکاندن و دژ وەستانی هاوئاینەکانی خۆی ، لە سەرەتای نامەکەدا دەڵێت : (لە ئاینی موسوڵمانان و جولەکە و مەسیحی فیرعەون کافرترین بونەوەری خودایە) منیش دەڵێم : خۆ ئەگەر وابێت و کافرترین بونەوەری خودا بێت ئەوا ئیبن تەیمیە دژ بە قورئان وەستاوەتەوە کە لە سورەتی البقرة لە ئایەتی ٣٤ دا خودای گەورە دەفەرموێت : (إِلاَّ إِبْلِيسَ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ) (واتا : هەموو فریشتەکان کڕنوشیان برد تەنها ئیبلیس نەبێت لوتبەرزی نواند و گوێڕایەڵ نەبوو و لە کافرەکان بوو) ، یان ئەوەتا ئیبلیس لە بونەوەران نیە تا کافر بێت یان ئەوەتا کافر نیە و لە بونەوەرانە ؟ لە هەردوو حاڵەتدا دژ بە قورئان دەوەستێتەوە قسەکەی ئیبن تەیمیە ، ئەمە جگە لەوەی کە هاتووە بەناوی ئاینی جولەکە و مەسیحیەت قسە دەکات لەکاتێکدا پێی وایە دین و کتێبەکانیان دەستکاری کراوە

2. ئیبن تەیمیە دەڵێت : (فیرعەون یەکێکە لەو کەسانەی لە قیامەتدا توندترین سزا دەدرێت) وادیارە بەڵگەکەشی ئەوەیە کە ئیبن عومەر فەرموویەتی : (توندترینی ئەوانەی لە ڕۆژی

قیـامەت سـزا دەدرێـن سـێ کەسـن کە ئەوانـیش دوورووەکـان و ئەوانەی بێبـاوەڕبوون لە ئەسـحابی مائیـدە و ئـالی فیـرعەونن) (سـەرچاوە : تفسـیر القرطبـي – تفسـیر سـورة النسـاء – آیـة ١٤٥ ) ، لاوازی تێگەیشـتنی ئیـبن تەیمـیە لە فەرمـوودە و ئایەتەکـانی بـووەتە هۆکـاری ئەوەی بکەوێـتە چەنـــدین هەڵەی زەقەوە ، چ فەرمـــوودەکە و چ ئـــایەتەکە باســـی ئـــالی فیـــرعەون دەکەن نەک فیـــرعەون و ئـــالی ، کە ئەم دوو دەربـــڕینە جیـــاوازن ، یەکەمیـــان فیـــرعەون نـــاگرێتەوە و دووهەمیان فیرعەون دەگرێتەوە ، ئەوەی لە حەدیسەکە هاتووە فیرعەون ناگرێتەوە

3. ئیـبن تەیمـیە وەک پیشـەی توندـڕەوی هەمیشـەی و حەزی بـۆ کوشـتارگەری لە نامەکەیـدا خـۆی دەکـاتە نـوێنەری هەمـوو موسـوڵمانان و بەنـاوی ئەوانەوە دەڵێـت : (هەمـوو موسـوڵمانان هـاوڕان لەسـەر ئەوەی کەوا هەرکەس فیـرعەون کـافر نەکـات و نەڵێـت لە دۆزەخە ئەوا دەبێـت پاشـگەز ببێـتەوە ئەگینـا دەکوژرێـت وەک لە دیـن دەرچـوویەک ، خـۆ ئەگەر کەسـەکە بڵێـت کەوا بـاوەڕدار بـووە و گومـانی لە بێبـاوەڕی فیـرعەون هەبێـت ئەوا بێبـاوەڕە ئەوکەسـە و کـوفرەکەی گەورەتـرە لە کـوفری ئەبـو لەهەب) ، لێـرەدا کە دەڵێـت هەمـوو موسـوڵمانان تەنهـا مەبەسـتی گـروپ و کـۆمەڵەکەی خـۆیەتی چـونکە ئەو هەمـوو بۆچـون و ڕاکـانی تـری پـێ پـوچەڵ بـوو و هەمـوو شـوێنکەوتوانی ڕا و بیروبۆچونەکـانی تـری بە کـافر و بێبـاوەڕ و لەئـاین دەرچـوو دەبینـی وەک لە کتێبەکـانی دەبینرێـت ، پاشـان وەک پیشـەی هەمیشـەی ئەم کەسـانە کە نـاتوانن ڕووبەڕوو بـوونەوە بە گفتوگـۆی زانسـت بـکەن بـۆیە پەنـا دەبەنە بەر هەڕەشـەی کوشـتن ، ئیـبن تەیمـیەش وەک درێژەپێـدەری کـار و پیشـەی بەنـی ئـومەیە و دەوڵەتـی ئـومەوی بەنـاوی دیـنەوە خـوێنی خەڵکـی حەڵاڵ دەکـرد و ئێسـتاش گـروپە توندـڕەوەکان بە بەڵـگەی کتێبەکـانی ئەوەوە کوشـتارگەری ئەنجـام دەدەن ، پاشـان ئیـبن تەیمـیە بێئاگـایە لەوەی کـاتێ خـودا لـۆمەی ئەبـو لەهەب دەکـات باسـی دەسـتی دەکـات (تبـت یـدا ابـي لهـب) نەوەک باسـی زمـانی بکـات کە چـی وتـووە ، چـونکە ئەبـو لەهەب بە کـردار دژایەتـی پەیـامهێنەری کـرد و ئـازاری دا ، ئایـا لەلای ئیـبن تەیمـیە کەسـێک کە

پێی وایە فیرعەون بڕواداره خراپتره لە ئەبو لەهەبێک کە بەو شێوەیە ئازاری پێغەمبەری دابێت ؟ ئەگەر بیروباوەڕێکی وەها بوونی هەبێت ئەوا گومانی تیانیە بیروباوەڕی فیرعەون لەم بیروباوەڕەی ئیبن تەیمیە باشترە

4. ئەگەرچی ئیبن تەیمیە لەم نامەیە وای داناوە وەڵامی باوەڕداریتی فیرعەون بداتەوە و دژی بوەستێتەوە ، بەڵام لەو چەند لاپەڕەیەی نوسیویەتی دەبینین زیاتر لە سێ لەسەر چواری کتێبەکەی هێرشکردنە سەر هەڵگرانی ئەو بیروباوەڕەیە و جارێک بە مولحید ناویان دەهێنێ و جارێک بە دووڕو و کافر و گومڕا و چەندین دەستەواژەی تر ، لەهەمان کاتدا هێرش دەکاتە سەر دۆستانی خودا و بە گومڕا و سەرلێشێواو ناویان دەهێنێت ، لەکاتێکدا ئیبن تەیمیە نوسراو و بەڵگە دەخاتە پێش عەقڵەوە بەڵام لەم بابەتەدا بە عەقڵ بڕیاری کافربوون و بێباوەڕی هەڵگرانی ئەم بیروباوەڕە دەدات

5. ئیبن تەیمیە لە نامەکەیدا هەڵگرانی ئەو ڕا و بۆچونە بە (ئیتیحادی) ناو دەهێنێت ئەمەش چونکە پێی وایە شوێنکەوتووانی شێخی ئەکبەر ئیبن عەرەبی پێیان وابێت خودا لەگەڵ بەندەکانی یەکدەگرن و دەبنە یەکێک ، لەکاتێکدا ئەمە بوختانێکی ڕوونە ، ئەوەتا شێخ ئیبن عەرەبی لە فتوحاتی مەککی دەفەرموێت : (من قال بالحلول فدينه معلول وما قال بالاتحاد إلا أهل الإلحاد) (واتا : هەرکەس بڵێ خودا دەچێتە ناو شتەکان ئەوا ئاینەکەی کێشەی تێدا هەیە و تەنها ئەوانە دەڵێن خودا و بەندەکان دەبنە یەکێک کە مولحیدن)

6. ئیبن تەیمیە سەرجەم ئەو ئایەتانەی دەیهێنێتەوە بۆ وەڵامدانەوەی شێخ ئیبن عەرەبی ئێمە لەم کتێبەدا ئاماژەمان پێیان داوە بۆ وەڵامدانەوەی تێگەیشتنە تەسک و هەڵەکانی ئیبن تەیمیە لە قورئانی پیرۆز و ئاینی ئیسلام

7. کە خودا دەفەرموێت بە فیرعەون : (لتكون لمن خلفك آية ) (واتا : تا ببیت بە نیشانەیەک بۆ ئەوانی دوای خۆت) ، لێرەدا ئیبن تەیمیە دەڵێت کە آية واتا پەند و عیبرەت ، بەڵام شێخ

ئیبن عەرەبی دەفەرموێت کەوا آیة واتا نیشانە ئەمەش بۆ ئەوەی هەرکەس ویستی باوەڕ بهێنێت لەدوای فیرعەون ئەو نیشانەیە هاندەر و ڕێنیشاندەری بێت کە وەک فیرعەون بەو شێوەیە باوەڕبوونیان دەربڕن و بڵێن ئێمە لە موسوڵمانانین

8. ئیبن تەیمیە لە نامەکەی دەڵێت ( فیرعەون لەوانەیە کە پەیامی موسای بە درۆ خستۆتەوە نەوەک تەنها بێباوەڕ بێت ، بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرێک گەورەترین کوفرە ، بەڵام هەموو کافرێک مەرج نیە پەیامەکە بەدرۆ بخاتەوە ، چونکە کافر هەیە کە سەرقاڵی حەز و ئارەزووەکانیەتی و شوێن پەیامەکە ناکەویّ ) ئێمەش هەر بە نوسراوەکەی ئیبن تەیمیە خۆی وەڵامی دەدەینەوە و دەڵێین : ئەگەر وابێت کەواتە فیرعەون لەوانەبووە کە سەرقاڵی حەز و ئارەزووەکانی بووە واتا حەزی دەسەڵات و ئارەزووی چەوسانەوە ، هەربۆیە ئەو حەزە وای لێکردووە نەچێت بەدەم بانگەوازی حەزرەتی موسا ، کەواتە ئەمە نایکاتە گەورەترین بونەوەری بێباوەڕ و بەمەش قسەکەی خۆی کە لە سەرەتای نامەکە وتویەتی بەدرۆ دەخاتەوە و بە پێچەوانەیەوە قسەی کردووە

9. ئیبن تەیمیە دەڵێت کەوا کاتێک فیرعەون بە موسا دەڵێت : (ولیدع ربه) (واتا : با خواکەی بانگ بکات) بەڵگەیە کەوا فیرعەون باوەڕی بەخوا نەبووە ، منیش دەڵێم ئەمە بەڵگەیەکی پوچەڵ و هەڵەیە چونکە باوەڕ بە یەقین دەچەسپێت و یەقینیش لە داواکردنی بەڵگەوە دروست دەبێت و بەڵگەکەش پێویستە هەستپێکراو بێت ، وەک لەم کتێبەدا باسی حەزرەتی ئیبراهیمم کردووە کە بە کۆمەڵە پرسیارێک لەخۆی بووە هۆی ئەوەی خودا بدۆزێتەوە ، فیرعەونیش دەیویست بەتەواوەتی ئەو کڵپە باوەڕەی لە دڵیدا پەرەی سەندووە بچەسپێت و خامۆش نەبێتەوە هەر بۆیە بەردەوام داوای بەڵگە دەکات و کۆشکی بەرز دروست دەکات تا خودا ببینێت ، هەموو ئەم هەوڵانەی بۆ چەسپینی باوەڕەکەی بووە ، لەهەمان کاتدا کە فیرعەون داوا دەکات کە موسا خوداکەی بانگ بکات ، ئەمە بۆ ئەوەیە کە فیرعەون لە دەسەڵات و توانای خوداکەی موسا

دڵنیـا ببێـتەوە گومـانی لە خـودا و بـون و دەسـەڵاتی نەمێنێـت ، وەک خـودای گەورە دەفەرموێـت : (قَالَـتْ رُسُـلُهُمْ أَفِـي اللَّـهِ شَـكٌّ) (سـورة إبـراهیم - ١٠)(واتـا : پێغەمـبەران دەیـانفەرموو ئایـا گومـان لە بـوون و دەسـەڵاتی خـودا هەیە؟) ، بـۆ نەمـانی ئەو شـک و گومـانە پێویسـت بە دروسـتبوونی دڵنیـایی و یەقـین هەبـوو کە ئەوەش بە بینـین و دڵنیـابوونەوە و دەرخسـتنی بەڵـگە پەیدادەبوو

10. ئیـبن تەیمـیە دەڵێـت کەوا فیـرعەون ئەو کـافرەیە کە زۆرتـرین جـار لە قورئانـدا باسـی کـراوە و نـاوی هێنـراوە ، لەکاتێکـدا ئەمەش هەڵەیە ، چـونکە شـەیتانە کە زیـاتر باسـی کـراوە ، شـەیتان ٧٥ جـار بە نـاوی شـەیتان و ١١ جـار بە نـاوی ئیبلـیس نـاوی هـاتووە لە قورئانـدا ، لەبەرامبەریدا فیرعەون ٧٤ جار ناوی هاتووە

11. ئیـبن تەیمـیە لە نامەکەیـدا دەڵێـت کەوا کاتێـک دەوترێـت "ال فرعـون" ئەوا فیـرعەونیش دەگـرێتەوە ، بـۆ ئەم ڕایەشـی بەڵـگە بە "آل إبـراهیم ، آل عمـران ، آل لـوط ، آل یاسـین ، آل أبـي أوفـی ، آل داود) دەهێنێـتەوە ، لە وەڵامـدا دەڵـێم (آل) لێـرەدا مەرج نیـیە ئەو کەسـەش بگـرێتەوە کە دەدرێـتە پـاڵی ، ئەوەتـا (آل لـوط) خێـزانەکەی حەزرەتـی لـوط نـاگرێتەوە چـونکە ئەویـش لەنـاوچوو ، بەڵام (آل إبـراهیم) خـاتوو سـارای خێزانـی حەزرەتـی ئیبـراهیمیش دەگـرێتەوە ، یـان (آل محمـد) ئەبـو لەهەب نـاگرێتەوە ، کەواتە هەروەک چـۆن دەکرێـت ئەو کـۆمەڵەیەی دەدرێـنە پـاڵ ناوێـک یەکێـک لەو کـۆمەڵەیە بەدەربێـت لەوان ، ئەوەهـاش دەکرێـت ئەوانەی کـۆمەڵەکە دەدرێـنە پـاڵی ئەویـش بەدەربێـت لەو کـۆمەڵەیە و تەنهـا بـۆ ناسـینەوە و پـۆلێنکردن بـدرێتە پاڵیـان ، لە قورئانـدا خـودا باسـی بـاوەڕدارەکەی ئـالی فیـرعەون دەکـات (مـؤمن آل فرعـون) لە سـورەتی غـافر ئـایەتی ٢٨ دا ، کەواتە هەروەک چـۆن ئەو بـاوەڕدارەی ئـالی فیـرعەون بەدەرە لە ئـالی فیـرعەون کە دەچـنە دۆزەخەوە ، بەهەمـان شـێوە فیـرعەون خۆشـی بەدەرە لە ئـالی فیـرعەون ، یـاخود ئەوکـاتە بـوو بەدەر لە ئـالی فیـرعەون کاتێـک وتـی : (مـن لە موسـوڵمانەکانم)

بەمەش خـــۆی و بـــاوەڕدارەکەی ئـــالی فیـــرعەون هەردوو هەمـــان بیروباوەڕیـــان پەیـــدا کـــرد و بەدەربوون لە ئالی فیرعەون

12. ئیـبن تەیمـیە لە نـامەکەی دەڵێـت : (فیـرعەون گەورەتـرین کەسـە لـوتبەرزی نوانـدبێت) ، لەم بابەتەشـدا هەڵەی کـرد ، چـونکە شـەیتان گەورەتـرینە ، شـەیتان لەنـاو هەمـوو فریشـتەکانی و سـەرەڕای ئەوەی بـۆ مـاوەیەکی زۆر خوداپەرستی دەکـرد ، بەڵام وتەی خـودای شـکاند و وتـی مـن لە ئـادەم باشـترم ، ئەمەش واتـا خـودا هەڵەی کـردووە و شـەیتان ڕاسـتی کـردووە ، لەکاتێکـدا فیـرعەون کاتێـک وتـی مـن خوداتـانم هۆکـارەکەی ئەوەبـوو کە هێشـتا ئاشـنا نەبووبـوو بە زاتێکـی دەسـەڵاتدارتر لە خـۆی کە ئەویـش خـودایە ، بـۆیە شـەیتان گەورەتـرین بێفەرمـانی کـردووە و گەورەترین لوتبەرزی نیشانداوە

13. ئیـبن تەیمـیە لە نامەکەیـدا ئایەتێـک دەکـاتە بەڵـگە کە لە سـورەتی هـود ژمـارە ٩٦ بـۆ ٩٩ دا هـاتووە : (وَلَقَـدْ أَرْسَـلْنَا مُوسَـى بِآيَاتِنَـا وَسُـلْطَانٍ مُبِـينٍ إِلَـى فِرْعَـوْنَ وَمَلَئِـهِ فَـاتَّبَعُوا أَمْـرَ فِرْعَـوْنَ وَمَـا أَمْـرُ فِرْعَـوْنَ بِرَشِـيدٍ يَقْـدُمُ قَوْمَـهُ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ فَـأَوْرَدَهُمْ النَّـارَ وَبِـئْسَ الْـوِرْدُ الْمَـوْرُودُ وَأُتْبِعُـوا فِـي هَـذِهِ لَعْنَـةً وَيَـوْمَ الْقِيَامَـةِ بِـئْسَ الرِّفْـدُ الْمَرْفُـودُ) (واتـا : موسـامان بە ئـایەت و بەڵـگە و دەسـەڵاتەوە نـارد بـۆ فیـرعەون و خەڵـکەکەی ، بەڵام ئەوان شـوێن فەرمـانی فیـرعەون کەوتـن لەکاتێکـدا فەرمـانی فیـرعەون هـی کەسـێکی هۆشـیار نـیە ، لە دواڕۆژدا گەلەکەی پـێش دەخـرێن و دەبـرێنە دۆزەخ و خراپتـرین شـوێن ، نەفرەتیـان لـێ دەکرێـت و دەخـرێنە خراپتـرین شـوێنەوە) ، ئەم ئـایەتەی ئەو دەیکـاتە بەڵـگە باسـی گەل و ئـالی فیـرعەون دەکـات نەک خـۆی ، لێـرەدا لە ڕۆژی دوایـی جیـاوازیەک هەیە لە نێـوان فیـرعەون و ئیبلـیس ، کە ئیبلـیس کاتێـک شـوێنکەوتوانی دەبـرێنە دۆزەخەوە ئەوا ئیبلـیس خـۆی بێـبەری دەکـات لێیـان و ئیبلـیس خۆیشـی دەچێـتە دۆزەخ ، بەڵام فیـرعەون بەپـێچەوانەوە خەڵـکەکەی خۆیـانی لـێ بێـبەری دەکەن بـۆیە فیـرعەون دەچێـتە بەهەشـت و ئەوان دەچـنە دۆزەخ ، کـاتێکیش ئیـبن تەیمـیە ئەوە دەکـاتە

**بەڵگە کە ئالی فیرعەون دەچنە دۆزەخەوە بەهۆی شوێنکەوتنیان بۆ فەرمانی فیرعەون و بەمەش فیرعەون بێباوەڕە ، لەمەشدا هەڵەیە چونکە فیرعەون ئەوکاتەی فەرمانیان پێدەکات هێشتا باوەڕی گوماناویە و کاتێک دەکەوێتە ناو دەریاکەوە ئەوکات باوەڕەکەی دەچەسپێت و بە دڵ و زوبان دانی پێدادەنێت**

## نامەیەکی شێخ جەلالەدینی دوانی لەسەر باوەڕی فیرعەون و تێبینیەکانی لێکۆڵەر لەسەری :

(سەرچاوە : إيمان فرعون ، الإمام جلال الدين الدواني ، تحق: ابن الخطيب ، المطبعة المصرية – مصر ، چاپی یەکەم ، ١٩٦٤)

شێخ جەلالەدینی دوانی لە نامەکەیدا دەفەرموێت :

((براکەم خودا من و تۆ ڕێنوێنی بکات بۆ ڕێگای ڕاست ، لە دەمارگیری و توندڕەوی بمانپارێزێت ، بزانە کەوا زانایانی ئیسلام ڕای جیاوازیان هەبووە لەسەر بیروباوەڕی فیرعەونەکەی سەردەمی حەزرەتی موسا ، تیایاندا هەبووە بە کافر و بێباوەڕی داناوە و تیایاندا هەبووە بە باوەڕداری داناوە ، منیش لەگەڵ ئەو ڕایەم کەوا ئایەتەکەی باسی ئاشکراکردنی باوەڕی فیرعەون دەکات ڕوونە کەوا باوەڕداریەکەی ئاشکرا دەکات ، کاتێک فیرعەون دەڵێت : "باوەڕم هێنا بەوەی کە بەنی ئیسرائیل باوەڕیان پێی هێناوە و من لە موسوڵمانانم" ، ئەوە واتا دڵنیابوومەوە کە هیچ پەرستراوێک نییە جگە لەو خودایەی کە بەنی ئیسرائیل باوەڕیان پێی هێنا ، کە ئەویش خودای گەورەیە کە حەزرەتی موسا و هارون خەڵکیان پێ ئاشنا کرد ، فیرعەون هەموو باوەڕی لە خودادا کۆکردەوە و لە دڵیەوە دانی پێدانا و بە زوبان دەری بڕی ، دانپێدانانی بە زوبان ڕووکەشەکەیە و باوەڕهێنانی بە دڵەکە کە دەڵێت (باوەڕم هێنا) بەستراوەتەوە بە (من لە موسوڵمانانم) ، هەربۆیە هەرکەسێک ئەقڵێکی دروست و هۆشداری هەبێت دەزانێت کەوا ئەم قسەیەی فیرعەون ئەوکاتە وتویەتی کە هۆشیار بۆتەوە ، نەک لەبەر ئەوەی لە ساتی خنکاندا بوو بەهۆی ئاوەوە ، زانایان فەرموویانە کە باوەڕ بە پشتڕاستکردنەوەیە لەلایەن دڵەوە ، دانپێدانانیشی بۆ جێبەجێکردنی حوکمەکانە ، چ جای فیرعەون کە بە دڵ و بە زوبانیش باوەڕەکەی ئاشکرا کرد و پاشان مرد ، هەربۆیە شێخ ئیبن عەرەبی فەرموویەتی (فیرعەون مرد پێش ئەوەی هیچ تاوانێکی تر ئەنجام بدات) ئەمەش چونکە دوای باوەڕهێنانەکە مرد و هەرکەس ببێت بە موسوڵمان خودا لە تاوانی پێشووی خۆش دەبێت وەک مافێکی

خـودایی بەبێ مـافی بەنـدەكانی كە لەسـەری دەمێنـنەوە ، كـاتێكیش شـێخ ئیـبن عەرەبـی دەفەرموێـت (ئەگەر فیـــرعەون بێهیـــوا بـــوایە لە ڕەحمـــی خـــودا ئەوا هەنگـــاوی نەدەنـــا بـــۆ باوەڕهێنـــان) ئەوا دەڵـــێم ئەمە قســـەیەكی ڕاســـت و شـــێوازێكی ڕاســـتە ، تەنهـــا ئەوانەش لێـــی تێنـــاگەن كە كاڵفـــامن بەرامـــبەر ئەم جـــۆرە قســـانە ، بەڵـــگەی قبـــوڵكردنی باوەڕەكەشـــی ئەوەیە كە خـــودا فەرمـــووی "الان وقـــد عصـــیت قبـــل" (واتـــا : ئێســـتا بـــاوەڕت هێنـــا كە پێشـــتر بێفەرمانیـــت دەكـــرد) ئەمەش لەبەر ئەوەی هـــیچ نەفـــی و ســـنوورداركردنێكی تێـــدا نیـــیە نیشـــانەی ئەوەیە كە بـــاوەڕەكەی قبـــوڵ كـــراوە ، كە خـــودا دەشـــفەرموێت "كە پێشـــتر بێفەرمانیـــت دەكـــرد" ئەمە واتـــا بە باوەڕهێنانـــت ئەو بێفەرمـــانیەش لاچـــوو و بـــاوەڕەكەت وەرگیـــرا ، ئەم ئـــایەتەی خـــودا دەیفەرموێـــت ئینكـــارێكی ئیبطـــالی نیـــیە كە ئینكـــاریەكە ببێـــتە هـــۆی بەتـــاڵكردنەوەی قســـەی بەرامـــبەر ، بەڵكـــو ئینكـــارێكی تەوبـــیخ و لـــۆمەكردنە كە ئامـــاژە بەوە بـــدات كە دواتـــر ڕوودەدات و بـــكەرەكەی زانـــراوە ، كە بەمانـــای ئەوەدێـــت كە دوای ئەوەی تاوانـــت كـــرد ئەوەتـــا ئێســـتا بـــاوەڕت هێنـــاوە ، هاوشـــێوەی ئـــایەتی (أتعبـــدون مـــا تنحتـــون) (الصـــافات : ٩٥) (واتـــا : ئایـــا ئێـــوە ئەوە دەپەرســـتن كە دایدەتاشـــن و نیگـــاری دەكێشـــن؟) ئەگەر كەســـانێكیش بڵـــێن كەوا فیـــرعەون لـــۆمەكراوە لە قورئانـــدا ئەوە دەڵێـــین لەبەرامـــبەردا چەنـــدین ئـــایەتیش هەیە لـــۆمەی موســـوڵمانی گوناهبـــار و ســـەرپێچیكار دەكـــات ، ئەگەر خـــودا لـــۆمە و سەرزەنشـــتی فیرعەونـــی كردبێـــت ئەوا هەر خـــودا خـــۆی فەرمـــوویەتی لە ســـورەتی مەریەم ئـــایەتی ٦٠ كەوا هەركەس تەوبە بكـــات و بگەڕێـــتەوە و بـــڕوا بهێنێـــت دەچێـــتە بەهەشـــتەوە ، نەفـــرەت لێكـــردنیش لە قورئانـــدا تەنـــانەت دەرحەق بە بـــڕواداریش هـــاتووە ، ئەوەتـــا خـــودا لە ســـورەتی النســـاء ئـــایەتی ٩٣ فەرمـــوویەتی كەوا هەركەســـێك باوەڕدارێـــك بكوژێـــت ئەوا جێگـــای دۆزەخە و خـــودا نەفرەتـــی لێـــدەكات و ســـزایەكی ســـەختی بـــۆ دانـــاوە {تێبینـــی لێكـــۆڵەر : لە تەفســـیری بغـــوی هـــاتووە كەوا ئەم ئـــایەتە دابەزیـــوە لەســـەر كەسێك بەنـــاوی مقـیس بـن صـبابە الكنـانی كە بەنـی نەجـار بـراكەی دەكـوژن ، ئەمـیش دەچێـت بـۆ تـــۆڵەكردنەوە ، ئەوانـــیش پـــارەی خـــوێنەكەی دەدەنـــێ ، بەڵام ئەو كە دەگەڕێـــتەوە لە ڕێگـــادا كەســـێك دەكوژێـــت لە تـــۆڵەی بـــراكەی بـــۆ ئەوەی هەم پـــارەكەی لابێـــت و هەم تۆڵەشـــی كـــردبێتەوە} ، هەروەهـــا

**فیـــرعەون لەکـــاتی ئـــاو چـــونە نـــاو دەم بـــاوەڕەکەی ئاشـــکرا نەکـــردووە چـــونکە قســـەکەی ڕوونە کە بە ڕســـتەیەکی تەواو هەمـــووی پـــێکەوە وتـــووە ، ئەمەش واتـــا لە ســـەرەمەرگدا نەبـــووە کاتێـــک بـــاوەڕەکەی ئاشـــکرا کـــردووە و ئەمەش وەڵامـــێکە بـــۆ ئەوانەی دەیانەوێـــت کە بە ئـــایەتی ئەوەی لە ســـەرەمەرگدا تەوبە قبـــوڵ نیـــیە بیانەوێـــت بـــاوەڕی فیـــرعەون بەتـــاڵ بـــکەنەوە ، ئەو باوەڕهێنـــانەی کە قبـــوڵکراو نیـــیە و لە قورئانـــدا باســـکراوە بـــریتیە لە باوەڕهێنـــان لە ڕۆژی قیـــامەت دا ئەگەرنـــا ئەو ئـــایەتەی فەرمایشـــتەکەی خـــودا دەبێـــتە پـــێچەوانە لەگەڵ ئـــایەتی ٩٨ی ســـورەتی یـــونس کە خـــودا فەرمـــویەتی کەوا تەنهـــا گەلـــی یـــونس کاتێـــک باوەڕیـــان هێنـــا ســـودی بۆیـــان هەبـــوو و بەڵا و نەهامەتیمـــان لەســـەریان لابـــرد ، ئەو ئایەتەشـــی لە ئـــایەتی ٨٨ ســـورەتی یـــونس هـــاتووە کە دەفەرموێـــت (وَقَـــالَ مُوسَـــى رَبَّنَـــا إِنَّـــكَ آتَيْـــتَ فِرْعَـــوْنَ وَمَلَـــأَهُ زِينَـــةً وَأَمْوَالًـــا فِـــي الْحَيَـــاةِ الـــدُّنْيَا رَبَّنَـــا لِيُضِـــلُّوا عَـــن سَـــبِيلِكَ رَبَّنَـــا اطْمِـــسْ عَلَـــى أَمْـــوَالِهِمْ وَاشْـــدُدْ عَلَـــى قُلُـــوبِهِمْ فَلَـــا يُؤْمِنُـــوا حَتَّـــى يَـــرَوُا الْعَـــذَابَ الْـــأَلِيمَ) (واتـــا : موســـا فەرمـــووی خـــودایە تـــۆ فیـــرعەون و دارودەســـتەکەیت دەوڵەمەنـــد و پـــارەدار کـــردووە لە دونیـــادا تـــاکو لەســـەر ڕێگـــا لامـــان بـــدەن ، پـــارە و پولیـــان لەنـــاو بـــبە و دڵیـــان تونـــد بـــکە هەتـــاکو ئەوکـــاتەی ســـزا ســـەختەکە دەبیـــنن و پاشـــان بـــاوەڕ دەهێـــنن) ئەم ئـــایەتەش بەڵـــگەیە بـــۆ ئـــێمە نەک لەســـەرمان بەڵـــگە بێـــت ، چـــونکە فیـــرعەون کاتێـــک خنکـــا بەوە ســـزا ســـەختەکەی بینـــی هەر بـــۆیە ئەوکـــاتە بـــاوەڕی هێنـــا و ئەمە ئامـــاژەیە بـــۆ قبوڵبـــوونی دوعـــاکەی حەزرەتـــی موســـا کە فیـــرعەون دوای خنکـــان کە ســـزا ســـەختەکەیە بـــاوەڕ بهێنێـــت) وەک بیضـــاوی لە مانـــای ســـزا ســـەختەکە دەڵێـــت کەوا بـــریتیە لە خنکـــان ، هەروەهـــا نەتەوەی فیـــرعەون لەکـــاتی خنکـــان باوەڕیـــان نەهێنـــا بـــۆیە ســـزای ســـەختی ئەوان کەوتە قیـــامەت ، ئەوانەشـــی شـــێخ ئیـــبن عەرەبـــی بە مولحیـــد دادەنـــێن ، ئەوکەســـانە خۆیـــان مولحیـــدن و تێنەگەیشـــتوون لە قســـەکانی کەســـێک کەوا زانـــای زاناکـــانیش نـــاتوانن لێـــی تێـــبگەن و بـــگەنە زانســـت و پـــێگەی ئەو ، شـــێخ ئیـــبن عەرەبـــیش کە باســـی بـــاوەڕداری فیـــرعەون دەکـــات بـــۆ نیشـــاندانی گەورەیـــی و فراوانـــی ڕەحمەتـــی خـــودایە و هانـــدانی بەنـــدەکانی خـــودایە لەســـەر بێهیوانەبـــوون لە ڕەحـــم و بەخشـــندەیی خودا ))**

## بەڵگەکانی لێکۆڵەر لەسەر ئەم بابەتە :

1. خـــوداى گەورە دەيزانـــى کە فيـــرعەون بـــڕوا دەهێنێـــت هەر بـــۆيە بە حەزرەتـــى موســـا و هـــاروونى فەرمـوو : [ فَقُولَـــا لَـــهُ قَوْلًـــا لَيِّنًـــا لَعَلَّـــهُ يَتَـــذَكَّرُ أَوْ يَخْشَـــى ] (طـه (٤٤)) (واتـــا : بە زمـانێکى نەرمونيـــان گفتوگـــۆى لەگەڵ بـکەن بەڵکـو بەهـــۆش بێـــتەوە يـــاخود بترســـێت) لێـرەدا کە حەزرەتـــى موسـا دەچێـتە بەردەم فيـرعەون دەفەرموێـت : [ هَـــلْ لَـــكَ إِلَـــى أَنْ تَزَكَّـــى * وَأَهْـــدِيَكَ إِلَـــى رَبِّـــكَ فَتَخْشَـــى ] [النـازعـات: ١٨-١٩] (واتـا : ئايـا ناکرێـت خـۆت چـاک بکەيـت ؟ و ڕێنيشـاندەرت بـم بـۆ خـودا تـا لێـى بترسـيت ؟) ، ئەم جـۆرە مـامەڵە و ڕەفتـارەى حەزرەتـى موسـا و ئەو جـۆرە فەرمـانەى خـودا بـۆ ئەوەى بە شـێوەيەکى نەرمونيـــان مـامەڵە لەگەڵ فيـــرعەون بکرێـت ، ئامــاژەن بــۆ ئەوەى خـــودا دەيزانـــى فيـــرعەون بـــاوەڕ دەهێنێـــت ئەگەر لەدوا ســـاتى ژيانيشـــى بێـــت و لەکۆتاييـــدا لە ڕاسـتيەکان تێـدەگات ، هەربـۆيە خـودا فەرمـووى : (لَعَلَّـــهُ يَتَـــذَكَّرُ أَوْ يَخْشَـــى) واتـا بەڵکـو بەهـۆش بێـتەوە و لەمـن بترسـێت ، کاتێـک فيـرعەون دەکەوێـتە نـاو دەريـاکە و گەورەيـى دەسـەڵاتى خـوداى بـۆ دەردەکەوێـت ئەوکـات بەهـۆش دێـتەوە ، کە بەهـۆش دێـتەوە و دەبينێـت وا نـوقم دەبێـت لەنـاو دەرياکە لەوکاتەدا ترسى خوداى لەدڵ دەنيشێت و دەڵێت : "من لە موسوڵمانانم"

2. وەک لە بەڵـگەى پێشـوو باسـم کـرد کەوا فيـرعەون بێئاگـا و بێهـۆش بـووە لە گەورەيـى دەسـەڵاتى خـودا ئەمەش بەهـۆى نەزانـيەوە بـووە ، بـۆيە خـوداى گەورە دەفەرموێت : (إِنَّمَـا التَّوْبَـةُ عَلَـى اللَّـهِ لِلَّـــذِينَ يَعْمَلُـــونَ السُّـــوءَ بِجَهَالَـــةٍ ثُـــمَّ يَتُوبُـــونَ مِـــنْ قَرِيـــبٍ) [النســاء:٤٨] (واتـــا : تەوبە و لێبـوردەيى خـودا بـۆ ئەو کەسـانەيە کە بە نەزانـى خراپەکـارى ئەنجـام دەدەن و پاشـان دەگەڕێـنەوە و تەوبە دەکەن پـاش مـاوەيەکى کەم ) ، فيـرعەونيش بەم شـێوەيە بەهـۆى نەزانـى و بێهۆشـييەوە خراپەکـارى ئەنجـام دەدا بەڵام لەکـاتى خنکانـدنى لەنـاو دەريـاکە بەهـۆش دێـتەوە و ئەوکـات دەگەڕێتەوە و تەوبە دەکات و باوەڕ دەهێنێت

3. ئەگەرچـی فیـرعەون پـێش خنکـانی لەنـاو ئـاوەکە زوڵـم و سـتەمێکی زۆری لە خەڵـک کـرد و چەنـدین کەسی بێتـاوانی کوشت ، بەڵام خـودای گەورە دەفەرموێت : (قُـلْ يَـا عِبَـادِيَ الَّـذِينَ أَسْـرَفُوا عَلَـىٰ أَنفُسِـهِمْ لَـا تَقْنَطُـوا مِـن رَّحْمَـةِ اللَّـهِ ۚ إِنَّ اللَّـهَ يَغْفِـرُ الـذُّنُوبَ جَمِيعًـا ۚ إِنَّـهُ هُـوَ الْغَفُـورُ الـرَّحِيمُ) (الزمـر:٤٨) (واتـا :بڵـێ و بفەرمـوو بەو بەنـدانەم کە زیادەڕۆییـان کـردووە کەوا بێهیـوا نەبـن لە بەخشـندەیی و میهرەبـانی خـودا ، خـودا لە هەمـوو تاوانێـک خـۆش دەبێـت) ، هەربـۆیە دەکرێـت خـودا لەو تاوانـانەی خـۆش بوبێـت بە باوەڕهێنـانی ، یـانیش وەک باوەڕدارێـک لە دوارۆژ (قیـامەت)دا سـزای بـدات ، بەڵام ئەوەی ئـێمە دەمـانەوێ ڕوونـی بکەیـنەوە سـزا و پاداشـتی دوارۆژ نییە بەڵکو باوەڕهێنانی فیرعەونە لە دونیا .

4. باوەڕهێنـانی فیـرعەون و باوەڕهێنـانی نەجاشـی خـاڵی هاوبەشـیان هەیە ئەگەرچـی خـاڵی جیاوازیشـیان هەبێـت ، نەجاشـی بـاوەڕی بە خـودا هێنـابوو بەڵام نەیدرکانـد هەتـاکو مـرد ، فیـرعەون بـاوەڕی بەخـودا هێنـا پـێش مـردن و درکانـدنی ، لەم بـابەتەدا زانایـانی ئەشـعەری دەفەرمـوون کە باوەڕهێنـان لە بنەڕەتـدا باوەڕهێنـانە بە دڵ ، کەواتە نەجاشـی بەم پێـوەرە بـاوەڕدار بـوو چـونکە بە دڵ بـاوەڕی هێنـابوو ، ئیـبن تەیمـیەی حەڕانـی و لایەنگـران و هاوفکرەکانیشـی دەڵـێن کەوا باوەڕهێنـان لە بنەڕەتـدا باوەڕهێنـانە بە دڵ و زمـان و کـردار ، ئیـبن تەیمـیە و لایەنگرانـی ئەگەرچـی دژایەتـی شـێخ ئیـبن عەرەبـی دەکەن بەڵام لەم بـابەتەدا هەر بەبیـر و بـاوەڕی خۆیـان دەیسـەلمێنن کەوا فیـرعەون بـاوەڕدار بـووە کاتێـک خنکـاوە ، ئەگەر بپرسـن چـۆن ؟ دەڵـێم : ئیـبن تەیمـیە دەڵێت کەوا بیروبـاوەڕ بـاوەڕبوونە بە دڵ و زمـان و کـردار ، بەڵام دەکرێـت کەسـەکە لە کـات و سـاتێک بـاوەڕبوون بە کـردارەکە بسـەلمێنێت و لە کـات و سـاتێکی تـردا بـاوەڕبوون بە زمـان و کـردارەکە بسـەلمێنێت و لەکۆتاییـدا هەرسـێکیانی سـەلماندووە ، کاتێـک فیـرعەون خنکـا بە دڵ و زمـان بـاوەڕی بە خـودا هێنـا ، بەڵگەمـان چییـە ؟ بـۆ ئەوەی کەوا فیـرعەون لەکـاتی خنکـان بەڵگەی بە زمـان هێنـا قسـەکەی خـۆیەتی کە دەڵێت : " آمَنـتُ أَنَّـهُ

**لا إِلَـهَ إِلاَّ الَّـذِي آمَنَـتْ بِـهِ بَنُـوا إِسْـرائِيلَ وَأَنـا مِـنَ الْمُسْـلِمِينَ" (يـونس : ٩٠) (واتـا : بـاوەڕم هێنـا بەوەی ئیسـرائیلیەکان باوەڕیـان پێـی هێنـاوە و مـن لە موسـوڵمانانم) لێـرەدا فیـرعەون بە زمـان بـاوەڕەکەی ئاشکرا کـرد ، لەهەمـان کاتـدا بە دڵـیش بـاوەڕی هێنـا چـونکە لە ئـایەتی دواتـر خـودای گەورە دەفەرموێـت : "آلْـآنَ وَقَـدْ عَصَـيْتَ قَبْـلُ وَكُنـتَ مِـنَ الْمُفْسِـدِينَ" (یـونس : ٩١) (واتـا: ئێسـتا بـاوەڕت هێنـا لەکاتێکـدا پێشـتر لە خراپەکـاران بویـت ) ، لە فەرمـوودەشـدا هـاتووە کە دەفەرموێـت : (إِنَّ اللّه لا يَنظُـرُ إِلـى أَجْسـامِكْم، وَلا إِلـى صُـوَرِكُمْ، وَلَكِـنْ يَنظُـرُ إِلَـى قُلُـوبِكُمْ وأعْمَـالِكُمْ) (صـحيح مسـلم : ٢٥٦٤) (واتـا : خـودا سـەیری جەسـتە و شـێوەتان ناکـات بەڵکـو دەڕوانێـتە دڵتـان و کردارەکانتـان) ، بەمەش تێگەیشـتین کە بە دڵـیش فیـرعەون بـاوەڕی هێنـاوە ، ئەوەی دەمێنێـتەوە کـردارەکەیە ، هەنـدێکجار کـردارەکە پـێش باوەڕهێنـان بە زمـان و دڵ دەکەوێ چـونکە دڵ پێویسـتی بە بەڵـگەی هەسـت پێکـراوە بـۆ باوەڕهێنـان ، لەکـاتی نەبـوونی بەڵـگەی هەسـت پێکـراو دڵ ئەسـتەمە بـاوەڕ بهێنێـت ، بەڵگەشـمان بـۆ ئەمە کەوا کـردارە دەبێـتە هـۆی پتەوبـوونی بـاوەڕ لە دڵـدا بـریتیە لە ئەو ئـایەتەی کە دەفەرموێـت : (وَكُلًّـا نَّقُـصُّ عَلَيْـكَ مِـنْ أَنبَـاءِ الرُّسُـلِ مَـا نُثَبِّـتُ بِـهِ فُـؤَادَكَ ) (هـود: ١٢٠) (واتـا : بەسـەرهاتی پێغەمبەرانـت بـۆ دەگێـڕینەوە بـۆ ئەوەی بـاوەڕداری لە دڵتـدا جێگیـر ببێـت) ، هەروەهـا دەفەرموێـت : (مَـا كَـذَبَ الْفُـؤَادُ مَـا رَأَى) (الـنجم : ١٨) (واتـا : دڵ ئەوەی بەدرۆ نەخسـتەوە کە بینـی) ، لێـرەوە دەمانەوێـت بگەیـن بەوەی کە بڵێـین فیـرعەونیش بـۆ ئەوەی دڵـی بچەسـپێت لەسـەر بـاوەڕ پێویسـتی بەوە بـوو شـتێکی گەورە ببینێـت کە دڵـی پـڕ لە بـاوەڕ بکـات ، هەربـۆیە بە هامـانی وەزیـری خـۆی دەڵێـت وەک لە قورئانـدا هـاتووە : (وَقَـالَ فِرْعَـوْنُ يَـا هَامَـانُ ابْـنِ لِـي صَـرْحًا لَّعَلِّـي أَبْلُـغُ الْأَسْـبَابَ - أَسْـبَابَ السَّـمَاوَاتِ فَـأَطَّلِعَ إِلَـى إِلَـهِ مُوسَـى وَإِنِّـي لَأَظُنُّـهُ كَاذِبًـا ) (غـافر : ٣٦ - ٣٧) (واتـا : ئەی هامـان کۆشـکێکی گەورە و مەزنـم بـۆ دروسـت بـکە بەڵکـو بـگەمە ئاسـمانەکان و بـڕوانم لە خـوداکەی موسـا ،**

**هەرچەنـــدە پـــێم وایە موســـا درۆ بکـــات) بـــۆیە ئەمە یەکەم هەنگـــاوی کردارەکـــی فیـــرعەونە بـــۆ دۆزیـــنەوەی خـــودا و باوەڕهێنـــان پێـــی کە بە چـــاو بگەڕێـــت بـــۆ بینینـــی ، بەڵام کە دەچێـــتە ســـەر کۆشـــکەکە و هـــیچ نابینێـــت ئەوکـــات هەنگـــاوی دووهەمـــی کردارەکـــی دەکـــات کە ئەویـــش وەک لە (تفســـیر الـــرازی – الامـــام الـــرازی – بەرگـــی ٢٤ – لاپەڕە ٢٥٣) هـــاتووە کەوا فیـــرعەون تیرێـــک هەڵ دەداتە ئاســـمان و تیـــرەکە بەخوێنـــاوی دێـــتەوە خـــوارەوە ، ئەوکـــات فیـــرعەون دەڵێـــت کەوا خـــودای حەزرەتـــی موســـای کوشـــتووە ، لێرەشـــدا خوێنـــاویبوونی تیـــرەکە گومـــان دەخـــاتە بـــاوەڕی نـــاو دڵـــیەوە بەوەی گومـــان بە دڵنیـــایی لادەچێـــت ، بەڵام فیـــرەعەون بەم ڕووداوە گومـــانی زیـــاتر کەوتە دڵـــی بـــۆ باوەڕهێنـــان بە خـــودا ، چـــونکە ئەو خـــودایەکی لاوازی نەدەویســـت کە بە تیرێـــک برینـــدار بێـــت و خـــوێنی لـــێ بچۆڕێـــت ، ئەو خـــودایەکی دەویســـت کە لەخـــۆی بەدەســـەڵاتدارتر و بەتوانـــاتر بێـــت ، هەر بـــۆیە کە خـــودا خنکانـــدنی لەوکـــاتەدا فیـــرعەون گەیشـــتە ئەو حەقـــیقەتەی کەوا خـــودا چەنـــدە بەدەســـەڵات و بەتوانـــایە ، ئەو دوو هەنگـــاوە کـــردارەکیەی فیـــرعەون بـــۆ دۆزیـــنەوەی خـــودای ڕاســـتەقینە هاوشـــێوەی هەنگـــاوە کردارەکیەکـــانی حەزرەتـــی ئیبـــراهیمە وەک لە ئـــایەتی ژمـــارە ٧٦ و ٧٧ و ٧٨ لە ســـورەتی الانعـــام هـــاتووە کەوا "کاتێـــک شـــەو ســـەیری ئاســـمانی کـــرد هەســـارەکانی بینـــی وتـــی ئەوانە خـــودامن ، بەڵام کە لاچـــوون زانـــی کەوا ئەوانە خـــودا نـــین ، پاشـــان وتـــی مانـــگ خـــودامە و کە بینـــی ئەویـــش لاچـــوو وتـــی ئەمە خـــودام نیـــیە ، پاشـــان ســـەیری خـــۆری کـــرد وتـــی ئەمە گەورەتـــرە کەواتە ئەمە خـــودامە ، بەڵام کە خـــۆرەکە ڕۆیشـــت فەرمـــووی هـــیچ لەوانە خـــودام نـــین " ، کەواتە حەزرەتی ئیبراهیم بەو شێوەیە گەڕا بەدوای خودای ڕاستەقینە و هەوڵی دۆزینەوە دا**

5. **خـــاڵێکی هـــاوبەش هەیە لەنێـــوان حەزرەتـــی یـــونس و فیـــرعەون بەوەی هەردووکیـــان باســـەکەیان بەســـتراوەتەوە بە ئـــاوەوە ، حەزرەتـــی یـــونس کە کەوتە نـــاو ســـکی حـــوت فەرمـــووی : (وَذَا النُّـــونِ إِذ ذَّهَـبَ مُغَاضِـبًا فَظَـنَّ أَن لَّـن نَّقْـدِرَ عَلَيْـهِ فَنَـادَىٰ فِـي الظُّلُمَـاتِ أَن لَّـا إِلَـٰهَ إِلَّـا أَنـتَ سُـبْحَانَكَ إِنِّـي كُنــتُ مِــنَ الظَّــالِمِينَ (٨٧) فَاسْــتَجَبْنَا لَــهُ وَنَجَّيْنَــاهُ مِــنَ الْغَــمِّ وَكَــذَٰلِكَ نُنجِــي الْمُــؤْمِنِينَ)**

(الأنبياء : ٨٧) (واتا : كاتێک یونس کەوتە ناو سکی حوتەکە لە تاریکیدا وتی خودایە هیچ خودایەک نییە جگە لە تۆ ، من بێفەرمانیم کردووە ، لەو تاریکیە ڕزگارمان کرد و بەو شێوەیە باوەڕداران ڕزگار دەکەین) ، فیرعەونیش کە خنکا وتی : " آمَنتُ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ الَّذِي آمَنَتْ بِهِ بَنُوا إِسْرائِيلَ وَأَنا مِنَ الْمُسْلِمِينَ" (یونس : ٩٠) (واتا : باوەڕم هێنا بەوەی ئیسرائیلییەکان باوەڕیان پێی هێناوە و من لە موسوڵمانانم) کەواتە فیرعەونیش لەو باوەڕدارانەیە کە خودا ڕزگاری کرد بەوەی لە تاریکی خۆپەرستی و خۆ بەخودا دانان ڕزگاری کرد و کردی بە باوەڕدار بە خودای گەورە پێش ئەوەی بمرێت

6. ، کاتێک فیرعەون کەوتە ناو ئاو حیکمەتەکە لەوەدابوو کە ئەو (أنا ربكم الأعلى – واتا : من خودای هەرەباڵاتانم) نییە ، کاتێک وتی (الاعلى) واتا هەرەباڵا ، لە ئەنجامدا بۆ ئەوەی خودا وانەی فێربکات خستیە ناو ئاو لە ژێر زەویدا ، ئەگەر لەکاتی خنکان باوەڕی نەهێنایە جەستەی نەدەهێنرایە دەرەوە و لەناو ئاوەکە دەمایەوە وەک وەڵامێک بۆی کەوا خۆی بە خودا داناوە ، بەڵام کە باوەڕی هێنا ، خودای گەورە تەنانەت ڕێزی لە جەستەکەشی نا و هێنایە دەرەوەی دەریاکە

7. ئەگەر حیکمەت لە مانەوەی جەستەی فیرعەون ئەوەبوبێت کە بێباوەڕ بووە تاکو ببێتە پەند ئەوا دەبوو جەستەی قارون و هاروت و ماروت و قابیل و نەمرود و یەئجوج و مەئجوج و ئەوانی تر بمایەتەوە تا ببنە پەند بۆ خەڵک ، بەڵام دەرکردنی جەستەی فیرعەون لەناو دەریاکە لەبەر چەند هۆکارێک بوو :

- خودا نیشانی بدات کە تەوبە و گەڕانەوەی بەندەکانی قبوڵ دەکات
- نیشانی بدات کە هەر بەندەیەکی بگەڕێتەوە و تەوبە بکات جەستەشی پارێزراو دەبێت و ڕێزی لێ دەگیرێت چ جای ڕوحی
- نیشانی بدات کە هیچ کەسێک لە ڕەحمی خودا بێهیوا نەبێت

- نیشانی بدات کەوا چۆن کەسێک کە خۆی بە خودا دەزانی لە کۆتاییدا بوو بە زەلیلترینی بونەوەران بەوەی کەوتە ناو ئاو و دوای باوەڕهێنانی تاجی شکۆداری و سەربەرزی کرایە سەر

8. لە کتێبی (البدایة و النهایة – ابن کثیر) لە بەرگی یەکەم لاپەڕە ٣١٥دا هاتووە کەوا فیرعەون و لەشکرەکەی شوێن حەزرەتی موسا و شوینکەوتوانی کەوتن بەناو ئەو دەریایەی کە بووبوو بە دووبەشەوە و ژێرەکەی وشکانی بوو و لاکانی ئاو و خەڵک بەسەر وشکانیەکە پەڕینەوە بۆ ئەودیو ، ئەمە بەڵگەیە کە فیرعەون ئەوکاتە باوەڕەکەی ئاشکرا کرد کە دەریاکە بووبوو بە دوو بەشەوە و هێشتا لێک نەدرابووەوە ، واتا هێشتا نەکەوتبووە ناو ئاوەکە ، بەڵام ئەو ساتەی ئاوەکان نزیک دەبوونەوە کە بەریەک بکەون ، ئەوکات فیرعەون بێدەسەڵاتی خۆی و دەسەڵاتداری خودای بینی ، بەمەش باوەڕی هێنا و وتی من لە موسوڵمانانم

9. خودای گەورە دەفەرموێت : (وأنجینا موسی ومن معە أجمعین. ثم أغرقنا الاخرین إن في ذلك لاية وما كان أكثرهم مؤمنين. وإن ربك لهو العزيز الرحيم) [یونس: ٩٠ - ٩٢] (واتا : موسا و ئەوەی لەگەڵی بوون ڕزگارمان کردن ، پاشان ئەوانی ترمان خنکاند ، ئەمە نیشانەیەکە ئەگەرچی زۆرێک لەوانەی خنکان باوەڕدار نەبوون ، خودا شکۆمەند و بەخشندەیە) ئەم ئایەتە بەڵگەیە کە فیرعەونیش لەگەڵ موسا و ئەوانە بووە کە ڕزگاریان بووە ، بەڵگەش ڕزگاربوونی جەستەکەیەتی ، چونکە هەموو لەشکرەکەی خنکان تەنها فیرعەون جەستەکەی ڕزگاری بوو ، کە خوداش دەفەرموێت کە زۆرێک لەوانەی خنکان باوەڕدار نەبوون ، نەیفەرموو هەموویان ، ئەمەش واتا فیرعەون لە باوەڕدارەکانی ناویان بوو

10. خودای گەورە دەفەرموێت : (وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ الْبَحْرَ فَأَنجَيْنَاكُمْ وَأَغْرَقْنَا آلَ فِرْعَوْنَ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ (البقرة : ٥٠) (واتا : دەریاکەمان کردە دوو بەشەوە و ئێوەمان ڕزگارکرد و ئالی فیرعەونمان خنکاند کاتێک ئێوە سەیرتان دەکرد) لێرەدا ئەم ئایەتە دەکەمە وەڵامێکی تر

**بــۆ ئیــبن تەیمــیە کە دەیــوت ئــالی فیــرعەون هاوشــێوەی ئــالی ئیبــراهیم و ئــالی عمــران ئەو کەسـانەش دەگـرێتەوە کە دەدرێـنە پـاڵ ئـالەکە ، بەمانـایەکی تـر دەیـوت فیـرعەونیش لەگەڵ ئـالی دەچــنە دۆزەخ وەک لە قورئانــدا هــاتووە ، بەڵام لەم بــابەتەش هەڵەی کــرد و نەیپێکــا ، ئەوەتــا لەم ئـــایەتەدا خـــودا دەفەرموێـــت کەوا ئـــالی فیرعەونـــی خنکانـــدووە ، بەڵام بە پشـــت بەســـتن بە ئایەتەکـانی تـر دەبینـین فیـرعەون جیـاواز لە لەشکر و ئـالی ئەو جەسـتەی ڕزگـاری دەبێـت و دێـتە دەرەوەی دەریــاکە ، کەواتە جیــاوازتربووە لە ال فرعــون کە هەموویــان خنکــان و فرعــون جەســتەی ڕزگاری بوو**

11. **فیــرعەون دەگــاتە پــلەیەک کە بتــوانێ گفتوگــۆی ڕاسـتەوخۆ لەگەڵ خــودادا بکـات هاوشـێوەی حەزرەتـی موسـا ، ئەوەتـا خـودای گەورە دەفەرموێت : (وَمَـا كَـانَ لِبَشَـر أن يُكَلِّمَـهُ اللَّـهُ إِلَّـا وَحْيًـا أَوْ مِــن وَرَاءِ حِجَـابٍ أَوْ يُرْسِـلَ رَسُــولًا فَيُـوحِيَ بِإِذْنِــهِ مَـا يَشَـاءُ إِنَّــهُ عَلِـيٌّ حَكِـيمٌ (الشـورى - ٥١) (واتــا : هــیچ مرۆڤێــک بــۆی نیــیە لەگەڵ خــودا بــدوێت مەگەر لەڕێگــای وەحــی یــاخود لە پشـت پەردە یــاخود لەڕێــگەی نێردراوێــک بــۆ ئەوەی پەیــام و مەبەسـتەکەی کە خــودا دەیەوێـت پێــی بگــات خــودا دانــایە) ، فیــرعەون ســەرەتا لەلایەن حەزرەتــی موســا و هــارون پەیــامی خــودای پــێ گەیەنــدرا ، بەڵام بــاوەڕی نەهێنــا ، دواتــر کە چــووە نــاو دەریــاکە بــاوەڕی هێنــا ، بەم باوەڕهێنــانەی خەڵاتکـرا بەوەی لەپشـت پەردەوە لەگەڵ خـودا گفتوگـۆ بکـات و خـودا مـژدەی ڕزگـاربوونی جەسـتەی پـێ بـدات و مژدەی قبوڵبوونی باوەڕی پێ بدات**

12. **کۆتــا خــاڵ ئەوەیە کە وەک شـێخ جەلالەدینـی دوانـی و شـێخ ئیـبن عەرەبـی فەرموویــان ئەم بــابەتە و وروژانــدنی و باسـکردنی بە پــلەی یەک مەبەسـت لێــی فراوانــی و گەورەیــی ڕەحــمەت و لێبوردەیی خودایە کە هەموو بونەوەران دەگرێتەوە**

## فەرمایشتی کۆمەڵێک لە زانایان وەک پشتگیریەک لەسەر ئەم بابەتە :

1. شێخ موحەممەد عەبدولڕەسولی مەدەنی بەرزنجی : لە کۆتا بابەتی لە کتێبی (الجاذب الغیبي إلى الجانب الغربي – دەستنوسی ژمارە ١٣٥٢ لە لاپەڕە ١٦٧) دەفەرموێت : (چەند کەسێک وەڵامی شێخ ئیبن عەرەبیان داوەتەوە لەسەر ئەم بابەتە ، لەوانەش {بیقاعی و ابن المقری و ئیبن حەجەر و عەلی القاری الحنفی} خوداش بۆ سەرخستنی شێخ ئیبن عەرەبی کۆمەڵە زانایەکی گەورەی هەڵساندەوە بۆ وەڵامدانەوەی ئەم کەسانە و ئەو نوسینانەی نوسیویانە ، زاناکانمان بە بەڵگەی بەهێز وەڵامی ئەوانیان داوەتەوە ، لەوانەشی کە وەڵامیان هەبووە بۆ سەرخستنی شێخ ئیبن عەرەبی کۆمەڵە زانایەکی گەورەن وەک عەلامە مهایمی کجراتی و جەلالی دوانی و جندی و قیصری و جامی و عەبدوڵلا ئەفەندی ڕۆمی ، منیش لەم کتێبە بەهەمان شێوە پشتگیریم کردووە و وەڵامم داوەتەوە بەناوی {التأیید و العون للقائلین بإیمان فرعون})

2. شێخ موئەییەدەدین جندی : کە یەکێکە لە ڕاڤەکارانی کتێبی فصوص الحکم لە لاپەڕە ٦٣٧ی ڕاڤەکەی لەو باسەی فیرعەوندا دەفەرموێت : (موسوڵمانان و جولەکە و مەسیحیەکان بە گشتی پێیان وایە فیرعەون بێباوەڕ و کافرە و لە دۆزەخە ، ئەمەش بەوەی بۆیان یەکلا بۆتەوە لە دژایەتی ئەو بۆ پێغەمبەرەکانی خودا و بەنی ئیسرائیل و بە کردەوە خراپەکانی ، بەڵام قورئان شاهیدی دەدات بە ڕاستگۆیی ئەو لە باوەڕەکەیدا لەکاتی خنکان پێش ئەوەی بکەوێتە سەرەمەرگ ، کەوا فریا کەوت باوەڕەکەی بدرکێنێت )

3. شێخ عەبدولڕەزاقی قاشانی : کە یەکێکە لە ڕاڤەکارانی کتێبی فصوص الحکم لە لاپەڕە ٢٥٤ دەفەرموێت : (ئەو باوەڕەی کە فیرعەون هەنگاوی بۆنا پێش مردنی ، هەندێک خەڵک ئینکاریان لەوەدا کرد کە قبوڵ بوبێت و بەمەش دژی فەرمایشتەکەی شێخی گەورەمان ئیبن عەرەبی وەستانەوە ، لەکاتێکدا قیاس جێگیری دەکات کە باوەڕەکەی ڕاستە و قبوڵ کراوە)

4. شـێخ داودی قیصـری : له کتێبـی {مطلـع خصـوص الکلـم فـي شـرح فصـوص الحکـم – بەرگـی ٢ لاپەڕە ١٢٧٢} دەفەرموێـت : (ئینکـاری و نکـوڵی لەوەدا ناکرێـت که شـێخ ئیـبن عەرەبـی فەرمـوویەتی ، چـونکه ئەو فەرمـانی پێکـراوە که ئەوە بڵێـت ، بەوەی کەوا هەرچـی نوسـیوە بە فەرمانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بووە)

5. شـێخ مەلا جـامی : له کتێبـی {شـرح المـلا جـامي علـی فصـوص الحکـم – لاپەڕە ٤٨٠} دەفەرموێـت : (ئەوەی شـێخ ئیـبن عەرەبـی فەرمـوویەتی ئەگەرچـی ڕایەکـی کەم بیسـتراو بەڵام ئەوانەی دژایەتـی شـێخ ئیـبن عەرەبـی دەکەن لەم بـابەتەدا زیـادەڕۆیی زۆریـان کـردووە ، لەکاتێکـدا ئەم زیـادەڕۆییە هیچ پێویست نییە)

6. شـێخ عەبـدولغەنی نابلسـی : له کتێبـی {خصـوص الـنعم فـي شـرح فصـوص الحکـم – لاپەڕە ٦٣١ و ٦٧٠} دەفەرموێـت : (ئەوەی ڕوونه ئەوەیه که ئەو بەڵگـانەی پشـتگیری بـاوەڕداریتی فیـرعەون دەکەن زۆرن ، ئەوەشـی شـێخ ئیـبن عەرەبـی له کتێبـی فصـوص فەرمـوویەتی "ئەوەی له دەروونـی خەڵکیـدا چەسپاوە که چەنـدە خراپەکـاری کـردووە فیـرعەون ئەوا ئەوە بەجـێ دەهێڵـین بـۆ خـودا" ، ئەمه لێـرەدا مەبەسـتی ئەوەیه که فیـرعەون هەر خراپەکـاریەکی کـردووە ئەوە بە خـۆدا بەجـێ دەهێڵـین ، بەڵام ئەوەی پەیوەنـدی بە بـاوەڕەکەیەوە هەیه ، لەم بـابەتەدا هـیچ گومانێـک نیـیه که بـاوەڕدارە لەلای ئەوانەی خـودا چـاوی دڵـی کـردوونەتەوە ، بـۆیە بـراکەم بـزانه که خـودا فیرعەونـی کـرد بە نیشـانەیەک کەوا له سـەرەتای تەمەنـی کەسێکی بێبـاوەڕ و گـومڕا و خراپەکـار بـوو و تەنـانەت بانگەشـەی خـودایەتی کـرد ، بەڵام دواتـر بـاوەڕی هێنـا و بـوو بە موسـوڵمان ، خـوداش له هەمـوو تاوانەکـانی خۆشـبوو و بە پـاکی مرانـدی) ، هەروەهـا شـێخی نابلسـی له شـیکردنەوەی کتێبـی (الطریقـة المحمدیـة – لاپەڕە ٣٦٧) و له کتێبـی (الحدیقـة الندیـة شـرح الطریقـة المحمدیـة -لاپەڕە ١٠٢) دەفەرموێـت : (دروسـت نیـیه نەفـرەت له فیـرعەون بکرێـت چونکه پێش مردنی تەوبەی کردووە و موسوڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاندووە)

7. **پێشەوا و سەرکردە شێخ عەبدولقادری جەزائیری : لەو کەسانە بوو کە زۆر پەیوەست بوو بە فەرمایشتەکانی شێخ ئیبن عەرەبی و تەنانەت دەوترێت کەوا هەموو ئەو کتێبانەی لەسەردەمی ئەودا لە دژی شێخ ئیبن عەرەبی نوسرابوون ، کۆی کردنەوە و سوتاندی ، هەروەها لە کتێبی (المواقف الروحية و الفيضات السبوحية – بەرگی ١ – لاپەڕە ٧١) جەزائیری دەفەرموێت :**

**(کاتێک خودا لە سورەتی النازعات ئایەتی ٢٥ دەفەرموێت :** (فَأَخَذَهُ اللَّهُ نَكَالَ الآخِرَةِ وَالأولَى) **ئەمە واتا خودا لە دەرئەنجامی خنکانی فیرعەون سزای دونیا و دوارۆژی لەسەر لابرد بەوەی کە باوەڕی هێنا)**

## هەندێک سەرچاوە کە پشتگیری لە باوەڕدارێتی فیرعەون دەکەن :

1. شرح قول ابن العربي في إيمان فرعون ، محمد بن قطب الدين الإزنيقي ، برنستون ، ٤٦٠٢
2. التأييـد و العـون للقـائلين بإيمـان فرعـون ، محمـد بـن عبدالرسـول المـدني البرزنجـي الحسـيني ، الخزانة الحسنية ، ١٢٢١٠
3. توفيـق العيـون فـي حـق إيمـان فرعـون ، عبداللـه بـن عبـدالعزيز الباليكسـري الرومـي الصـوفي الحنفي الخلوتي ، هدية العارفين ، بەرگی یەکەم ، لاپەڕە ٤٨٥

# پێڕست


**پێشەکی** ........ 2

**پوختەیەک لە ژیاننامەی شێخ ئیبن عەرەبی** ........ 3

**پێشەکی و هۆکاری لێکۆڵینەوە لەم بابەتە :** ........ 6

**فەرمایشتەکانی شێخ ئیبن عەرەبی لەسەر فیرعەون :** ........ 7

**نامەیەکی ئیبن تەیمیە لە وەڵامدانەوەی شێخ ئیبن عەرەبی و و تێبینیەکانی لێکۆڵەر لەسەری :** ........ 13

**نامەیەکی شێخ جەلالەدینی دوانی لەسەر باوەڕی فیرعەون و تێبینیەکانی لێکۆڵەر لەسەری :** ........ 20

**بەڵگەکانی لێکۆڵەر لەسەر ئەم بابەتە :** ........ 23

**فەرمایشتی کۆمەڵێک لە زانایان وەک پشتگیریەک لەسەر ئەم بابەتە :** ........ 30

**هەندێک سەرچاوە کە پشتگیری لە باوەڕدارێتی فیرعەون دەکەن :** ........ 33